# بیروباوەڕی منداڵی موسوڵمان





ئامادەکردن : عبدالله علی

پێداچونەوە : م.عبدالجبار بابانی

ئەدیبان

# بیروباوەڕی منداڵی موسوڵمان

نوسینی
عبدالله علی

پێداچونەوەی
م.عبدالجبار بابانی

# دەربارە

ناونیشان : بیروباوەڕی منداڵی موسوڵمان

ئاستی پەرتووک : ئاستی دووەم

نوسینی : عبدالله علی محی الدین

پێداچونەوەی : م.عبدالجبار ابراهیم بابانی

دیزاین (ناوەوە و دەرەوە) : نەواز گروپ

سالْی چاپ : ١٤٤٢ کۆچی - ٢٠٢١ میلادی

بۆ پەیوەندی کردن بە نوسەر:

Abdulla Ali ٠٨ ٠٦ ١٥٨ ٠٧٥٠

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

الحمدلله الذي علمنا ما لم نعلم ، وتفضل علينا بما هو اعظم ، وصلى الله وسلم على خير معلم سيدنا و نبينا محمد ﷺ وەک دەزانین زانستی عەقیدە گرنگترین و باشترین و لەپێشترین زانستە ، چونکە بنچینەی دینی ئیسلامە و کلیلی بانگەوازی پێغەمبەرانە و هۆکاری سەرکەوتن و یەکڕیزی موسوڵمانانە و هۆکارێکە بۆ خۆش بەختی و دڵنیای لە دونیا و قیامەتتدا ، بۆیە پێویستە لەسەر دایکان و باوکان و مامۆستایان و خەمخۆران گرنگی تەواو بە پەروەردەی منداڵەکانیان بدەن لەسەر عەقیدەیەکی ڕاست بۆ ئەوەی بەبەردەوامی لەسەر ڕاستە ڕێی ئیسلام بمێنن و توشی لادان و گومڕایی نەبن.

بۆیە بە پێویستم زانی ئەم کتێبە ئامادەبکەم تا ببێتە سەرەتایەک بۆ فێربوونی عەقیدەیەکی ڕاست و دروست کە هەندێک لە بابەتە هەرە گرنگ و پێویستەکانی عەقیدەی موسوڵمانی لە خۆگرتووە و بەشێوەیەکی کورت و پوخت و شێوازی پرسیار و وەڵام و نەخشاندنی وێنەی ڕەنگین تیایدا ڕێکخراوە تا بەئاسانی فێری ببن ولێی تێبگەن.

هیوادارم ببێتە جێی ڕەزامەندی خوای گەورە و سوودمەندبوونی منداڵی موسوڵمانان و داواکارم لە خوای گەورە لێم وەربگرێت و ببێتە هۆی سڕینەوەی تاوانەکان و زیادبوونی چاکەی خۆم و باوکم و دایکم.

هەوڵ و ماندووبوونی مامۆستای بەڕێز ( عبدالجبار ابراهيم بابانی ) بەرز دەنرخێنم لە هاندانم و پێداچونەوەی ئەم کتێبە خوای گەورە پاداشتی خێری بداتەوە و سەرفرازی دونیا و قیامەتی بکات.

عبدالله علی محی الدین

٨ - محرم - ١٤٤١ کۆچی ٧ - ٩ - ٢٠١٩ میلادی

﴿ لَّيۡسَ ٱلۡبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ قِبَلَ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ

وَلَٰكِنَّ ٱلۡبِرَّ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلۡكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ ......... ﴾

البقرة - ١٧٧

چاكە تەنها ئەوە نييە كە ڕووبكەنە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا

بەڵكو چاكە ئەوەيە كە هەر كەسێک ئيمان بێنێ بەخوای گەورە و بەڕۆژی دوايی و

بەمەلائيكەت و بەكتێبە ئاسمانييەكان و بەسەرجەم پێغەمبەرانی خوا


پرسیاری یەکەم
بۆچی پێویستە لەسەرم فێری بابەتەکانی عەقیدە ببم ؟
وەڵام
بۆ ئەوەی خوای گەورە لێم ڕازی بێت و ڕزگارم بێت لە فیتنە و سەر لێتێکچوون (الشبهات) و ڕزگارم بێت لە سزای خوای گەورە.


پرسیاری دووەم
یەکەم کاری پێویست چییە
لەسەر بەندە کە بیزانێت و
ئەنجامی بدات ؟
وەڵام
یەکەم کار بریتییە لە : ناسینی خوای گەورە
کە تاك و تەنهایە و شەریکی نییە.


پرسیاری سێیەم
بە چ شتێك خوای گەورە
بناسم ؟
وەڵام
بە بەڵگە و نیشانە ڕوون وئاشکراکان و
دروستکراوەکانی وەك
شەو و ڕۆژ و مانگ و خۆر و ئاسمانەکان و
زەوی و ئەوانەی تیایدان و
ئەوانەی لە نێوانیاندایە.


پرسیاری چوارەم
بۆچی خوای گەورە
دروستی کردووین ؟
وەڵام
بۆ ئەوەی بە تەنها بیپەرستین و
شەریکی بۆ دانەنێین.


پرسیاری پێنجەم
چۆن خوای گەورە بپەرستین ؟
وەڵام
دەبێت خوا بپەرستین بەو شێوەیەی خوای گەورە و پێغەمبەر ﷺ فەرمانیان پێکردووین ، کارێک ئەنجام نەدەین کە ئەوان داوایان نەکردبێت.


پرسیاری شەشەم
بەندایەتی (عیبادەت) چییە ؟
وەڵام
بەندایەتی : بریتییە لە ئەنجامدانی هەرشتێك کە خوای گەورە پێی خۆشە و لێی ڕازییە لە ووتە و کردارە ئاشکرا و نادیارەکان.


پرسیاری حەوتەم
نمونەی عیبادەتە نادیارەکان
کە بە دڵ ئەنجام
دەدرێت چییە ؟
وەڵام
بریتییە لە :
ترسان لە خوای گەورە
پشتبەستن بە خوای گەورە
خۆش ویستنی خوای گەورە
هیوا بوون بە خوای گەورە


پرسیاری هەشتەم
نمونەی ئەو عیبادەتانەی
کە بە ووتە ئەنجام
دەدرێت چییە ؟
وەڵام
بریتییەلـە :
پـــاڕانـــەوە
هاوار بۆ بردن
داوای یارمەتی
نەزربـڕیاڕدان


پرسیاری نۆیەم
نمونەی ئەو عیبادەتانەی کە بە لاشە ئەنجام دەدرێت چییە ؟
وەڵام
بریتییەلە :
نوێژکردن سەربڕین
حەج کردن


پرسیاری دەیەم
مەرجەکانی وەرگرتنی عیبادەت و کردەوەی چاك چین ؟
وەڵام
یەکەم : ئەنجامدانی بە نیەت پاکی و دڵسۆزی بۆ ڕەزامەندی خوای گەورە.
دووەم : شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەر ﷺ لە عیبادەتەکاندا.


پرسیاری یانزەهەم
پلەکانی دین (ئایین) لە ئیسلامدا کامانەن ؟
وەڵام
بریتییە لە :
١ئیسلام ٢ئیمان
٣ئیحسان


پرسیاری دوانزەهەم
دینی ئیسلام
بریتییەلە چی ؟
وەڵام
بریتییەلە : خۆبەدەستەوەدان بۆ خوای گەورە
بە پەرستنی بە تەنها و ملکەچ بوون بۆ
فەرمانەکانی و دورکەوتنەوە لە هاوەڵ
پەیداکردن بۆی و لەوانەی شەریکی بۆ
دادەنێن.


پرسیاری سیانزەهەم
پایەکانی ئیسلام چین ؟
وەڵام
١ شایەتومان
أشـــهـد أن لا إلـه إلا الله
و أشهد أن محمد رسول الله
٢ ئەنجامدانی نوێژ.
٣ زەکات دان.
٤ بەڕۆژووبوونی مانگی ڕەمەزان.
٥ ئەنجامدانی حەجی ماڵی خوا.


پرسیاری چواردەهەم
واتای
لا إله إلا الله
چییـە ؟
وەڵام
واتە : هیچ پەرستراوێك نیە بە ڕاستی شایەنی پەرستن بێت جگە لە زاتی الله.

## پرسیاری پانزەهەم

### مەرجەکانی **لا إله إلا الله** چین ؟



## وەڵام

1. **العلم:** زانینی واتاکەی.
2. **الیقین:** دڵنیابوون و دڵ دامەزراندن لەسەری.
3. **القبول:** ڕازی بوون و قبوڵکردنی ئەو شتانەی ئەم ووتەیە دەیگرێتەوە.
4. **الانقیاد:** ملکەچ بوون و گوێڕایەڵی بۆ خوای گەورە.
5. **الاخلاص:** دڵسۆزی و ئیخلاص بۆ خوای گەورە.
6. **المحبه:** خۆشەویستی تەواو بۆ خوای گەورە.
7. **الصدق:** بە ڕاست دانان و باوەڕپێکردن بە خوای گەورە.


پرسیاری شانزەهەم
واتای
أشهد أن محمد رسول الله
چییە ؟
وەڵام
واتە :
شایەتی دان و بەڕاست دانانی تەواو
کە محمد ﷺ بەندە و نێردراوی خوای گەورەیە و
ناردوویەتی بۆ گشت خەڵك و کۆتا پێغەمبەرە ﷺ


پرسیاری حەڤدەهەم
ئەرکی سەرشانمان چییە
بەرامبەر پێغەمبەر ﷺ ؟
وەڵام
ئەرکی سەرشانمان بریتییەلە : بەڕاستگۆ زانینی لەوەی
گەیاندوێتی و گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی و دورکەوتنەوە
لەو شتانەی ڕێگری لێ کردووە و خوا پەرستی کردن
بەو شێوەیەی ئەو ئەنجامی داوە.


پرسیاری
هەژدەهەم
ئیمان چییە ؟
وەڵام
بریتییەلە : باوەڕبوون بە دڵ و دەربڕینی
بە زمـان و جێبەجێکردنی بە ئەندامەکانی
لـەش ، ئیمان بە گوێڕایەڵی زیاد دەکات و
بەسەرپێچی کەم دەکات.

## پرسیاری نۆزدەهەم

پایەکانی ئیمان چییە ؟

## وەڵام

١ باوەڕبوون بە خوای گەورە.

٢ باوەڕبوون بە مەلائیکەتەکان.

٣ باوەڕبوون بە کتێبە ئاسمانیەکان.

٤ باوەڕبوون بە پێغەمبەران.

٥ باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی.

٦ باوەڕبوون بە قەدەر بە خێرو شەڕییەوە.




پرسیاری بیستەم
بەشەکانی ئیمان
چەندن ؟
وەڵام
بریتییەلە : حەفتا و ئەوەندە بەش
بەرزترینیان ووتنی لا إله إلا الله و
نزمترینیان لابردنی ناڕەحەتییە لەسەر
ڕێگای خەڵکی ، شەرم و حەیاش
بەشێکە لە ئیمان.


پرسیاری
بیست و یەکەم
پلەی چاککاری (ئیحسان) چییە ؟
وەڵام
بریتییە لەوەی : بە جۆرێك خوا پەرستی بکەیت وا بزانیت و هەست بکەیت کە خوای گەورە دەبینیت ، ئەگەر تۆ ئەو نەبینیت ئەوا دڵنیابە ئەو تۆ دەبینێت.


پرسیاری
بیست و دووەم
ئیمان بە خودا چییە ؟
وەڵام
باوەڕبوونە بەوەی کە : خوای گەورە تاك و تەنهایە
لە پەروەردگارێتی و پەرستراوێتی و ناوەجوانەکانی و
سیفاتە بەرزەکانیدا.


پرسیاری بیست و سێیەم
«التوحید الربوبیە» چییە ؟
وەڵام
بریتییەلە : باوەڕبوون بە تاك وتەنهایی
خوای گەورە لە ( دروستکردن و خاوەنداریێتی
و نەخشەدانان و ژیاندن و مراندن )دا کەواتە
هیچ دروستکارێك و هیچ نەخشەکێشێك و
هیچ ژێنەرێك و هێچ مرێنەرێك نییە
جگە لە زاتی الله.


پرسیاری
بیست و چوارەم
«التوحید الالوهیه»
چییە ؟
وەڵام
بریتییەلە : باوەڕبوون بە تـــاك وتەنهایی
خوای گەورە لە سەرجەم عیبادەتەکان کە
بە دڵ و زمان و لاشە ئەنجام دەدەرێت
لەلایەن بەندەکانییەوە.


پرسیاری
بیست و پێنجەم
«التوحید الاسماء الصفات»
چییـــە ؟
وەڵام
بریتییەلە : باوەڕبوون بە تاك و تەنهایی خوای گەورە
لە ناوە جوانەکان و سیفاتە بەرزەکانیدا بەبێ
وێناکردن(لێکچواندن) و چۆنێتی بۆ دانان و لەکارخستن
و لادان و تێکدانی ماناکانی.


پرسیاری
بیست و شەشەم
نمونەی ناوە جوانەکانی
خوای گەورە کامەیە ؟
وەڵام
العلیم زانـــا
الحکیم دانـــا
الملك پـاشـا
البصیر بینــەر
السمیع بیسەر
القدوس پیـرۆز
السلام ئاشتی بەخش

## پرسیاری بیست و حەوتەم

نمونەی سیفەتە بەرزەکانی خوای گەورە کامەیە ؟



## وەڵام

لە نمونەی سیفەتە بەرزەکان :

١. قسەکردنی خوای گەورە.
نمونە : قورئان فەرمایشتی خوای گەورەیە و دروستکراو نییە.

٢. خوای گەورە لەسەر عەرشە بەو شێوەیەی شایستەی خۆیەتی

٣. خوای گەورە سیفەتی پێخۆشبوون و خۆشەویستی هەیە.

٤. خوای گەورە سیفەتی پێناخۆشبوون و توڕەبوونی هەیە.


پرسیاری بیست و هەشتەم
خوای گەورە لە کوێیە ؟
وەڵام
خوای گەورە لەسەر عەرشە
لـەسـەرو ئـاسمانەکانەوە
بەو شێوەیەی شایستەی خۆیەتی.


پرسیاری
بیست و نۆیەم
گەورەترین تاوان
چییـە ؟
وەڵام
بریتییەلە : شیرك
واتە : هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە.


پرسیاری سییەم
واتای شیرك چییە ؟
وەڵام
بریتییەلە: ئەنجامدانی عیبادەت.
بۆ غەیری خوای گەورە


پرسیاری
سی ویەکەم
چەند جۆر شیرك هەیە ؟
وەڵام
دوو جۆر شیرك هەیە :
یەکەم : شیرکی گەورە : بریتییە لەو جۆرە شیرکەی خاوەنەکەی لە ئاگری دۆزەخدا دەمێنێتەوە بە هەمیشەیی ئەگەر تەوبەی لـەسەر نەکردبێت.
دووەم : شیرکی بچوك : بریتییە لـەو جۆرە شیرکەی لە گـوناهە گەورەکان گەورەترە ، بەڵام خاوەنەکەی بە هەمیشەیی لە ئاگردا نامێنێتەوە.

## پرسیاری
## سی و دووەم

**نمونەی شیرکی گەورە چییە ؟**

# وەڵام

نمونەی شیرکی گەورە وەك :

١. پاڕانەوە و پەنابردن و داوای یارمەتی لە غەیری خودا لەو شتانەی تەنها لە دەسەڵاتی خوای گەورەدان.

٢. چواندن و یەکسانکردنی هەرشتێك بە خوای گەورە لە کاتی ترس و هیواپێ بوون و خۆشەویستیدا.

٣. سەربڕین بۆ غەیری خوای گەورە بە مەبەستی خۆ لێ نزیکردنەوە و بەگەورەدانان ((التعظیم)).

٤. کڕنوش بردن بۆ غەیری خوای گەورە.

٥. سوڕانەوە(طواف) بە دەوری کەعبە بە مەبەستی نزیك بوونەوە لە خوای گەورە نمونە : سوڕانەوە بە دەری گۆڕدا.



## پرسیاری سی و سێیەم

نمونەی **شیركی بچوك** چییە ؟



## وەڵام

نمونەی شیركی بچوك وەك :

١ (ڕیا) ڕووپامایی

٢ سوێندخواردن بە غەیری خوای گەورە.
وەك : بە پێغەمبەر ﷺ ، بە سەری باوكم ، بە كەعبە ، بە نیشتیمان

٣ وتنی: ئەگەر ویستی خودا و تۆی لەسەربێت.
وتنی: لەسایەی خودا و سەری تۆوە.

٤ هەڵواسینی چاوەزار و ناڵ و پەت كە بڕوات وابێت هەڵواسینیان و بەستنیان لە خراپە و ناخۆشی دوورت دەخاتەوە.

## پرسیاری سی و چوارەم

بۆچی پێغەمبەر ﷺ دژایەتی و شەڕی کرد لەگەڵ موشریك و بێ باوەڕەکاندا ، لە کاتێکدا ئەوان باوەڕیان وابوو کە خوای گەورە پەروەردگار و دروستکاری بونەوەرە ؟

## وەڵام

لەبەر ئەوەی خوای گەورەیان بە تەنها نەدەپەرست و بەندایەتیان بۆ نەدەکرد بەڵکو عیبادەت و بەندایەتیان بۆ غەیری خوای گەورەش دەکرد.




پرسیاری
سی و پێنجەم
باوەڕبوون بە
مەلائیکەت چییە ؟
وەڵام
بریتییەلە : باوەڕبونێکی تەواو بەبێ دوو دڵی بە بوونی مەلائیکەت و
دروستبوونیان لە نوور و سیفەتەکانیان و ناوەکانیان و ئەو کارانەی
ئەنجامی دەدەن و زۆری ژمارەیان ، کە تیایاندایە بۆمان باسکراو و
ئەوانەش بۆمان باس نەکراوە.

## وەڵام

بریتییەلە : باوەڕبونێکی تەواو بەبێ دوو دڵی ، کە خوای گەورە پێغەمبەرانی لە مرۆڤەکان خۆیان ناردووە ، وەحی و سروشی بۆ کردوون و پشتیوانـــی لێ کردوون بـــە چەندین بەڵـــگە و نیشانەی ڕوون و ئاشکرا بۆ ڕێنیشانـــدانی خەڵکی و بانگکردنیان بۆ پەرستنی خوای تاك و تەنیا.

## پرسیاری سی و شەشەم

باوەڕبوون بە پێغەمبەران چییە ؟




پرسیاری
سی و حەوتەم
بۆچی خوای گەورە پێغەمبەرانی
ناردووە بۆ مرۆڤایەتی ؟
وەڵام
بۆ گەیاندنی پەیامی خودایی و
بانگکردنی خەڵکی بۆ خوا پەرستی و
دورکەوتنەوە لە هاوەڵ دانان بۆی.

## پرسیاری سی و هەشتەم

ئەو پێغەمبەرانە کامانەن کە بەخاوەن ئیرادەی بەهێز(الوا العزم) ناسراون ؟

### وەڵام

ئەگەر چی هەموو پێغەمبەران خاوەن ئیرادەی بەهێز بوون بەڵام پێشەنگەکانیان بریتیین لە نوح (عليه السلام)، ئیبڕاهیم (عليه السلام)، موسا (عليه السلام)، عیسا (عليه السلام)، محمد ﷺ کە کۆتا پێغەمبەرە سەلامی خودایان لێ بێت

## پرسیاری سی و نۆیەم

**باوەڕ بوون بە کتێبە ئاسمانییەکان چییە ؟**



## وەڵام

**بریتییەلـە : باوەڕبوونێکی تەواو بەبێ دوو دڵـی ، کە خودای گەورە چەندین کتێبی ناردۆتە خوارەوە بۆ هەندێك لە پێغەمبەران کە هەموویان فەرمایشتی خوای گەورەن و ڕووناکی و ڕێنیشاندەری مرۆڤ بوون.**

**وەك : زەبور ، صوحوف ، تەوڕات ، ئینجیل ، قورئان**


پرسیاری چل
کۆتا کتێبی ئاسمانی کە خوای گەورە ناردوویەتی کامەیە ؟
وەڵام
کۆتا کتێب بریتییەلە : قورئان کە وتەی خوای گەورەیە و جێگرەوە و لـەکارخەری سـەرجەم کتێبـەکانـی پێش خـۆیەتی.


پرسیاری چل و یەکەم
ئەرکی سەرشانمان بەرامبەر
قورئان چییە ؟
وەڵام
بریتییەلە : بە گەورەزانین و خوێندنەوە و
لەبەرکردن و زانینی واتاکەی و پەیڕەوکردنی
فەرمانەکانی و فێرکردنی خەڵکی و پاراستنی و
ڕێزلێگرتنی.


پرسیاری
چل و دووەم
بۆچی قورئان
بخوێنینەوە ؟
وەڵام
بۆ ئەوەی لێی تێبگەین و واتاکەی
بزانین و لەژیانی ڕۆژانەماندا
پەیڕەوی بکەین ، سەرەڕای ئەوەی
بە خوێندنەوەی پاداشتێکی زۆر
مسۆگەر دەکەین و جۆرێکە لە عیبادەت.

## پرسیاری چل و سێیەم

باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی چییە ؟



## وەڵام

بریتییەلە : باوەڕبوونێکی تەواو بەبێ دوو دڵی بەو ڕووداوانەی لە دوای مردن ڕودەدەن لەوانە:

١ سزا و خۆشییەکانی ناوگۆڕ.

٢ ئەو ڕووداوانەی لە قیامەتتدا ڕوودەدەن لەوانە : (زیندووبوونەوە و کۆکردنەوە(حشر) ، دانانی تەرازوو بۆ کێشانی کردەوەکان ، وەرگرتنی نامەی کردەوەکان ، لێپرسینەوە ، پاداشت دانەوە ، تکاکردن(شفاعە) خواردنەوەی ئاو لە حەوزی کەوسەر(الحوض الكوثر) ، پەڕینەوەی پردی صسڕات).

٣ باوەڕبوون بە بەهەشت و خۆشیەکانی و بینینی خوای گەورە.

٤ باوەڕبوون بە دۆزەخ و سـزا و ناخۆشیەکانی.


پرسیاری چل و چوارەم
کەی قیامەت ڕوودەدات ؟
وەڵام
زانینی کاتەکەی لای خودایە ، هیچ کەس کاتی
ڕوودانی نازانێت جگە لە خوای گەورە.


پرسیاری چل و پێنجەم
ئەو پرسیارانە چین لێمان دەکرێت لە ناو گۆڕدا ؟
وەڵام
لێمان دەپرسن :
خوات کێیە ؟
پێغەمبەرت کێیە ؟
دینت چییە ؟



## پرسیاری چل وشەش

**باوەڕبوون بە قەزاوقەدەر چییە ؟**

### وەڵام

بریتییەلە : باوەڕبوونێکی تەواو بەبێ دوو دڵی کە خوای گەورە زانا و ئاگادارە بە هەموو شتێك وە هەموو ئەوانەشی لە (لوح المحفوظ)دا نوسیوەتەوە ، هەرکات ویستی هەبوونی شتێکی هەبێت دروستی دەکات ، وە هیچ شتێك لە قەزاوقەدەری خوا دەرناچێت ، کەواتە دەبێت باوەڕمان بەسەرجەم ئەو ڕووداوانە هەبێت کە ڕوودەدەن لە ژیانی ڕۆژانەماندا بە خێر و شەڕیەوە بە خۆشی و ناخۆشییەوە لە بچوکترینەوە بۆ گەورەترین هەمووی بە فەرمانی خوای گەورەیە وە تەنانەت ئەو ڕووداوانەش کە لە کەوندا ڕوودەدەن هەمووی بە فەرمانی خوای گەورەیە.


پرسیاری چل و حەوتەم
باوەڕبوون بە غەیب چییە ؟
وەڵام
بەڕاست دانان و باوەڕبوون بە شتانێك کە نادیار و شاراوەن وەك: نەبینی (مەلائیکەت و جنۆکە) و ڕووداوەکانی داهاتوو و ڕوداوەکانی دوای مردن و قیامەت و خۆشییەکانی بەهەشت و سزای دۆزەخ ، کە خوای گەورە لە ڕێگەی(وەحی)یەوە هەواڵی هەموو ئەوانەی داوە بە پێغەمبەر ﷺ


پرسیاری چل و هەشتەم
ئایا هیچ کەس جگە لە خوای گەورە
لە زانستی غەیب(شتە نادیارەکان) دەزانێت ؟
وەڵام
نەخێر هیچ کەس لە
ئاسمانەکان و زەویدا غەیب نازانێت
جگە لە خوای گەورە ، وە ئەوانەی کە
خوای گەورە خـــۆی
ئاگاداریان دەکاتەوە.

## پرسیاری چل و نۆیەم

**مافی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ چییە لەسەرمان ؟**



## وەڵام

مافی هاوەڵان ئەوەیە لەسەرمان کە :

١ باوەڕمان بە فەزڵ و گەورەییان هەبێت.

٢ خۆشمان بوێن.

٣ دوعای خێریان بۆ بکەین.

٤ بە چاکە باسیان بکەین.

٥ شوێن کەوتەیان بین (بە پێشەوای خۆمانیان بزانین).

٦ تانە و تەشەریان لێ نەدەین و جنێویان پێ نەدەین.

٧ ئەو کەسانەمان خشبوێت کە ئەوانیان خۆش دەوێت.

٨ ڕقمان لە کەسانە بێت کە ڕقیان لێیانە و تانە و تەشەریان لێ دەدەن و جنێویان پی دەدەن.



## پرسیاری پەنجا

**بەڕێزترین و لە پێشترین هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ کامانەن ؟**

### وەڵام

**بەڕێزترین و لەپێشترین هاوەڵان ئەمانەن :**

١ ئەبوبەکری صدیق.

٢ عومەری کوڕی خەطاب(الفاروق).

٣ عوسمانی کوڕی عەفان(ذو النورین).

٤ عەلی کوڕی ئەبوطالیب.

٥ شەش کەسەکەی تر کە مژدەی بەهەشتیان پێدراوە.

٦ ئەوانی کۆچیان کردووە لە مەککەوە بۆ مەدینە (المهاجرین).

٧ پشتیوانانی شاری مەدینە (الانصار).

٨ بەشداربووانی غەزی بەدر.

٩ بەشداربووانی غەزی ئوحود.

١٠ بەشداربووانی پەیمانی ڕەزامەندی ( بیعە الرضوان).

١١ سەرجەم هاوەڵان بە گشتی.


پرسیاری پەنجا و یەکەم
مافی کەس و کار و خزمە نزیکەکانی
پێغەمبەر ﷺ کەموسوڵمان بوون چییە
لەسەرمان ؟
وەڵام
مافیان لەسەرمان ئەوەیە کە خۆشمان بوێن و
لایەنگریان بین ، ئەو کەسانەمان خۆش بوێت
کە خۆشیان دەوێن و ڕقمان لەو کەسانە بێت
کە ڕقیان لێیانە ، وە زیادەڕۆیی نەکەین لە حەقیاندا.


پرسیاری
پەنجا و دووەم
بە چی نزیك دەبینەوە
لە خوای گەورە ؟
وەڵام
بە گوێ ڕایەڵی کردنی و ئەنجامدانی کردەوەی
چاك و پاڕانەوە لێی بەناوە جوانەکانی و
سیفاتە بەرزەکانی.


پرسیاری
پەنجا و سێیەم
دۆستانی پەروەردگار کێن ؟
وەڵام
ئەوانەن لە باوەڕداران کە پەیڕەوی
قورئان و سونەتەکانی پێغەمبەر ﷺ دەکەن.


پرسیاری
پەنجا و چوارەم
دۆستان و لایەنگرانی
شەیتان کێن ؟
وەڵام
ئەوانەن دژایەتی خوای گەورە و پێغەمبەرﷺ
دەکەن لە وتە و کردەوەکانیاندا.


پرسیاری پەنجا و پێنج
پاداشتی ئەو کەسە چییە گوێڕایەڵی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکات ؟
وەڵام
سەرفرازی دونیا و قیامەتە و پاداشتـــی بەهەشـتـە.


پرسیاری
پەجا و شەشەم
سزای ئەو کەسە چییە
سەرپێچی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ
دەکات ؟
وەڵام
سەرشۆڕ و دۆڕاوی دونیا و قیامەتە و
سزای دۆزەخـــــە.


پرسیاری
پەنجا و حەوتەم
گەورەترین ماف دوای مافی
خوای گەورە و پێغەمبەر
چـــییە ؟
وەڵام
مافی
دایك و باوكە.


پرسیاری پەنجا و هەشتەم
نیشانەکانی خۆشەویستی بۆ
پێغەمبەر ﷺ چییە ؟
وەڵام
بریتییەلە : گوێڕایەڵی کردنی و شوێنکەوتنی و
خۆشویستنی خۆی و کەسوکارە موسوڵمانەکانی و
هاوەڵانی ، وە صەلاواتدان لە دیداری ﷺ


پرسیاری
پەنجا و نۆیەم
سەرچاوەی وەرگرتنی زانیاری
بیروباوەڕ(عقیدە) کامانەن ؟
وەڵام
بریتیین لە قورئان و
فەرموودە دروستەکانی پێغەمبەر ﷺ


پرسیاری شەست
داهێنراو(بیدعە) لە
دیندا چییە ؟
وەڵام
بریتییەلـە : داهێنـانی هـەر شتێکی نوێ
لـە دینی خوای گەورەدا کە پێغەمبەر ﷺ و
هـاوەڵان و شوێنکەوتوان نەیان کردووە و
لەسەری نەبوون.


پرسیاری
شەست و یەکەم
خۆشەویستترین کردار لای
خوای گەورە چییە ؟
وەڵام
بریتییەلە :
ئەنجامدانی نوێژ لە کاتی خۆیدا.
چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك.
تێکۆشان لە ڕێی خوادا.


پرسیاری
شەست و دووەم
خۆشەویستترین وتە لای
خوای گەورە چییە ؟
وەڵام
بریتیین لە :
سبحان الله
الحمدلله
لا اله الا الله
الله اكبر

پرسیاری
شەست و سێیەم
مەرجەکانی
وەرگیرانی تەوبە چیە ؟

## وەڵام

بریتیین لە : وازهێنان لە تاوان و نەگەڕانەوە سەری و پێ ناخۆشبوون بەئەنجامدانی تاوانەکە ، پێ ناخۆشبونی گەڕانەوە بۆ سەر تاوانەکە هەروەك چۆن پێی ناخۆشە فڕێ بدرێتە ئاگرەوە ، گێرانەوەی حەق و مافی خەڵکی ئەگەر لامان بوو.



# پێڕست